# ئاخۆ ئەمە چ باڵندەیەك بێت؟



نووسین و وێنەکێشان: ڤلادیمیر سوتاییڤ
لە ڕووسییە بۆ ئەڵمانی: ھ. ئەنگەرۆڤا
لە ئەڵمانییەوە بۆ کوردی: سەلام عەبدوڵا
لە کتێبی(Lustge Geschichen)



هەبوو نەبوو، قازێکی زۆر گێل و خۆپەرەست هەبوو. دەیویست هەموو شتێکی هەبێت. هەمیشە خۆیی گیف دەکردەوە، ئاژاوەی دەنایەوە، باڵندەکانیش سەریان بۆ با دەداو دەیانگوت: (بڕوانن، چ قازێکی سەیرە.) ڕۆژێکیان ئەم قازۆکەیە،



لەناو گۆمێکدا، مراوییەکی بینی، گەردەنێکی درێژی زۆر جوان هەبوو.
قازۆکەکە لە بەر خۆیەوە وتی: (ئاخ، منیش دەمەوێت گەردەنێکی وا جوانم هەبێت. و بە مراوییەکەیوت: (تکات لێ دەکەم، گەردەنی خۆتم بدەرێ، منیش گەردەنی خۆمت دەدەمێ.)



قازەکە کەوتە ڕێ، بەڵام نەیدەزانی چی بە گەردەنە درێژە جوانەکەی بکات. جارێکیان بە دیوی ڕاست بایدەدایەوە، جارێک بە دیوی چەپ، هەندێ جاریش خولی دەدایەوە. ئەوەی ڕاست بێت، گەردەنەکە بە باشی بۆی نەگونجا.





قازۆکەکە کەیفی بەم ئاڵوگۆڕە هات. بە ماسیگرێك گەیشت، قاچەکانی لە گەلدا گۆڕییەوە. قاچێکی زۆر جوانی باریك و درێژی لێ وەرگرت.



دوو باڵە سپییە بەهێزەکەی، بە باڵە ڕەشە بچووکەکەی قەلەڕەشەکەکە، گۆڕییەوە.



هەروەها تاوسێکی بینی، ماوەیەکی درێژی خایاند هەتا ڕازی کرد، کلکە جوان و ڕەنگاوڕەنگەکەی لێ وەربگرێت. ئەی ئەم چی دەدات بە تاوسەکە: کلکێکی بڕیا و لاواز!



**کەڵەشێرێکی خواردە، پۆپنەکەی سەری و دەنگەکەی پێشکەش بە قازۆکەکە کرد.**



ئێستا قازۆکەکە، چیتر لە هیچ باڵندەیەکی ئەم سەرزەمینە ناچێت. بە قاچە درێژەکانی ماسیگرەکە شانازی دەکرد، بە باڵە بچووکەکانی قەلەڕەشەکەکە لە شەقەی باڵی دەدا، بە گەردنە درێژەکەی مراوییەکە، گەردەنی بە هەموو لایەکدا، دەسووڕاند.

ڕۆژێکیان، ڕووبەڕووی کۆمەڵێ قاز بوو. هەموویان پێکەنینیان پێ هات و وتیان: ئاخۆ ئەمە چ باڵندەیەکی بێت؟ لە وەڵامدا وتی: من قازم. پاشان باڵەکانی بزواند، گەردەنیشی سووڕاندو بە هەموو هێزێکییەوە قوقاندی: قی قی قی...قی قی. من لە هەموو باڵندەکان جوانترم!

قازەکان پێیان وت: باشە، ئەگەر تۆ قازی، لەگەڵماندا وەرە.



هەر هەموویان پێکەوە بۆ ناو چیمەنێك ڕۆیشتن. هەموو لەوەڕان، قازۆکەکە نەبێت، بە دەنوکە تورەکییەکەی پێ نەکرا تەڵە گیایەکیش بخوات.



پاشان چوون بۆ لای گۆمێك، هەموویان مەلەوانیان کرد، قازۆکەکە نەبێت، بە قاچە درێژەکانییەوە، لە قەراغی گۆمەکە، ڕاوەستابوو، نەیدەتوانی مەلەوانی بکات. قازەکان لە قاقای پێکەنینیاندا هاهاهاها. قازۆکەکەیش لە وەڵامدا: قی قی قی قی کرد.





کاتێك قازەکان لە ئاوەکەوە هاتنە دەرەوە،
بینیان ڕێویەك خۆی لەناو زەلەکان مات داوە،
زیرەیان لێ هەستا و بۆ ئاسمان فڕین، تەنها
یەکێك نەبێت، پێی نەکرا بفڕێت: قازۆکەکە هەر چەند باڵە
فڕێی کرد، نەیتوانی هەڵفڕێت، هاواری لێ هەستا، چونکە پەڕە
درێژەکانی کلکەکەی لە زەلەکان گیری کرد.



ڕێوییەکە گەیشتە سەری پڕی دایە گەردەنە درێژەکەی. قازەکان ئەمەیان بینی، بە فڕین هەڵمەتیان هێنا بۆ سەر ڕێوییەکە و لە هەموو لایەکەوە دەنووکیان لێدا تا ناچاریان کرد، قازۆکەکە بەربدات و هەڵبێت.



قازۆکەکە: قازە خۆشەویستەکان، سوپاستان دەکەم، ئێوە رزگارتان کردم، زۆر سوپاستان دەکەم، ئیتر من دەزانم دەبێ چی بکەم.



پاشان ڕۆیشت بۆ لای ئەو باڵندانەی کە لەگەڵیاندا، ئاڵوگۆڕی کردبوو. هەرچی لێیان وەرگرتبوو، گەڕاندییەوەو ئەوانەی خۆی وەرگرتەوە. ئەم جارەیان قازۆکەکە لە قاز دەچوو، بەڵام نە گێل و نە خۆپەرست.

چیرۆکی قازەکە کۆتایی پێهات. هەر کەسێك بیەوێت، زۆر شت لەم چیرۆکە فێر دەبێت.